زنجیرەی پەیامەکانی
یەکتا پەرستی
( ١١ )

# مەرجەکانی ئیسلام و

## ئەو دەخاڵەی ئیسلام هەڵدەوەشێننەوە

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

مكتبة الغرباء

ئەم پەیامە یەکێکە لەبڵاوکراوەکانی مکتبة( الغرباء )

کراوەتە کوردی بەکەمێک دەستکاری یەوە

# مەرجەکانی ئیسلام

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه .. لە پاشاندا ( أما بعد )

ئەی برا ، ئەی خوشکی موسڵمانم خوا رەحم بە ئێمە و ئێوە بکا ، بزانە ئەو سێ بنچینەی کە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاوو ئافرەت بیانزانێ ئەمانەن :

یەکەم : بەندە ( عبد ) پەروەردگاری خۆی بناسێ

دووەم : بەندە ئایینەکەی ( ئیسلام ) بناسێ

سێ یەم بەندە پێغەمبەری گەورەی ئیسلام ﷺ بناسێ

* پەروەردگارمان ئەو خوایەیە کە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو جیهانیانە بەنازو نیعمەتەکانی هەر ئەویش پەرستراومانە و هیچ پەرستراوی ترمان نی یە

* ئایینەکەمان : ئیسلامە ، بریتی یە لە خۆدانە دەست خواو بەتاق و تەنیای بزانین وەگوێ رایەڵ و ملکەچی خوا بین و یەخەش هەڵتەکێنین لە هاوبەش پەیدا کردن و ئەوانەی هاوبەشی بۆ خوا دادەنێن

پێـغـەمـبـەرمـان : مـوحـەمـەدی کـوڕی عـەبدوڵلای کـوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمە هاشمیش لە قورەیشە ، قورەیشیش لە عـەرەبە ، عـەرەب لە نەوەی ئیـسـمـاعـیلی کـوڕی ئیـبـراهیـمی خۆشەویستی خوایە ( علیهم الصلاة والسلام )

* ئەگـەر ئەوانەت زانی ئەی خـوشـک و برای شـیـرینم لە پاشاندا بزانە بنچینەو بناغەی ئایین دووشتە

یەکەم : خـوا فـەرمـانی داوە بەندایەتی بۆ بکەین وە هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێین و لەسـەر ئەمـە سـوور بین . وە هەر لەبەرئەمەش دۆستایەتی یەکتر بکەین ، وە ئەو کەسەش بەکافر تێ بگەین کە خوا بە تاق و تەنیا نازانێ و بەندایەتی بۆ ناکا

دووەم : ترساندنی ئەو کەسەی لەبەندایەتی کردن هاوبەشی بۆ خـوا دادەنێ ، لەسـەر ئەو هاوبەشی دانانە بۆ خـوا لێ ی تووڕە دەبین و دوژمنایەتی دەکەین .

## مەرجەکانی لا إله إلا الله

١ - زانـسـت یانی بزانی مانای ( لا إله ) چی یە .. بە مانا دوور خستنەوەی ( نفي ) کردنی هەموو خوایەکەو ( إلا الله ) جێگیر ( اثبات ) کردنە بەمانا هیچ خوایەک نیە شایانی پەرستن بێ تەنها ( الله ) نەبێ ، بەم جۆرە دڵ مانای بزانێ و بەزمانیش

بەم مانایەوە بڵێن وەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فاعلم انه لا إله إلا الله ﴾ محمد ١٩، یانی ( یا موحەممەد ﷺ بزانە هیچ خوایەک نی یە بێجگە لە « الله » ) وە لە ئایەتێکی تر دەفەرمویٚ ﴿ الا من شهد بالحق وهم یعلمون ﴾ الزخرف ٨٦ یانی ( تەنیا ئەو کەسانەی شەهادەتیان بەحەق داوە و باوەڕیان هێناوە ئەوە شەفاعەت لای خوا سوودیان پێ دەگەیەنێ ئەمە دەزانن ئەوان) . پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمویٚ « من مات وهو یعلم ان لا إله إلا الله دخل الجنة ) مسلم

یانی ( هەر کەسێک بمریٚ بشزانێ تەنها یەک خوا هەیە کە « الله » یە ئەوانی تر هەمووی باطل و پوچن دەچێتە بەهەشت )

یانی هیچ پەرستراوێک نی یە شایانی بەندایەتی بۆ کردن بێ تەنها ( اللّه ) نەبێ ، وەبەندایەتی ( عباده ) بۆ کردنی بریتی یە : لەهەرچی خوا پێ ی خۆشەو پێ ی رازی یە لە کردارو لە گفتاری دیارو نادیار..

٢ - یەقین : یانی بەتەواوی مانای ( لا إله إلا الله ) بزانی و ماوەی هیچ شک و گومان نەمێنێ وەکو خوای گەورە دەفەرمویٚ ﴿ إنما المؤمنون الذین آمنوا بالله ورسوله ثم لم یرتابوا وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبیل الله أولئك هم الصادقون ﴾ الحجرات

١٥ . یانی ( بەراستی باوەڕدارە راستەقینەکان ئەوانەن باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەر هێناوە و دان بە تاقی تەنهایی خوا دەنێن و دان بە پێغەمبەرێتی موحەممەد و پەیامەکەی دادەنێن هیچ شک و گومانیشیان لە باوەڕەکەیان نی یە جیهادیش دەکەن بەسەرو بەماڵ ئەوانە لەباوەڕەکەیان راست دەکەن ) پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ : « أشهد أن لا إله إلا الله ، وإني رسول الله ، لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة » مسلم .

واتە : ( شایەتی دەدەم کە تەنها یەک خوا هەیە و ئەمن نێردراوی خوام ، هەر کەسێک بەو بیرو باوەڕە بچێتە خزمەت خوا ، بەلام دوودڵ نەبێ تیایدا هەر دەچێتە بەهەشتەوە )

٣ - ئیخلاس بەو مانایە خوای گەورە لە هاوبەش بۆ دانان دوور بخەیەوە لە بەندایەتی دا خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ الا لله الدين الخالص ﴾ الزمر ٣ . یانی ( ئەی خەڵکینە ئاگادار بن خوا بەندایەتی بۆ کردنەکی دەوێ کە « بەبێ گەردی »بێ ) . یان دەفەرموێ ﴿ وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء ﴾ البينة ٥

واتە ( حاڵ وایە فەرمانیان پێدراوە لە تەورات و ئینجیل تەنها خوای گەورە بپەرستن و بەبێ گەردی ( خالص ) بەندایەتی

خوا بکەن بەگوێرەی ئاینی ئیسلام )

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ : « أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا إله إلا الله خالصا مخلصا من قلبه) رواه البخاري . واتە ( بەختەوەرترین کەس بەشەفاعەتی من رۆژی قیامەت ئەوانەن بەبێ گەردی و موخلیسی وتبی لا إله إلا الله )

٤ - خۆشەویستی ( المحبة ) خۆشەویستی ئەم وشەو ئەو شتانەی ئەم وشە پێویستی دەکەن و کەیف پێ هاتنی ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ومن الناس من يتخذ دون الله أندادا يحبونهم كحب الله والذين آمنوا أشد حباً لله ﴾ البقرة ١٦٥ . واتە ( کەسانێک هەن بێجگە لە خوا چەند هاو وێنەیەک بۆ خوا دا دەنێن و هێندەی خوا خۆشیان دەوێ ، بەلام باوەڕداران خوایان پتر « لە هەموو شتێ » خۆشتر دەوێ ) . پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ : « ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان : أن يكون الله ورسوله أحب اليه مما سواهما ، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يلقى في النار » متفق عليه . واتە : ( هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تێدا بێ ، ئەوە شیرینی باوەڕی چەشتووە ، خواو پێغەمبەری لەهەموو کەس خۆشتر بوێ و ئەگەر

یەکێکی خۆش ویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت وە پێ ی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە سەر کوفر پاش ئەوەی خوا لە کوفر رزگاری کرد هەروەک چۆن پێ ی ناخۆشە بچێتە ناو ئاگر )

٥ - راست گۆیی ( الصدق ) یانی لەدرۆکردنی دوور بخاتەوە بەرگری لێ بکا لە دوو روویی ، خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين ﴾ العنكبوت ٣

واتە ( خوا دەزانێ کێ لە باوەڕهێنانەکەی راست دەکاو کێ لەباوەڕهێنانەکەی درۆ دەکا ) . وە دەفەرموێ ﴿ والذي جاء بالصدق وصدق به أولئك هم المتقون ﴾ زمر ٣٣

واتە ( ئەوانەی بەراستی هاتوون پێغەمبەرەکانن وە ئەوانەی باوەڕیان پێ دەهێنن و بەراستیان دەزانن ئەوە باوەڕدارەکانن وە هەر ئەوانیش لە خوا ترسەکانن )

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : « من مات وهو يشهد ان لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله صادقا من قلبه دخل الجنة » رواه أحمد . واتە : ( هەر کەسێ مردو شایەتی دەدا یەک خوا هەیە شایانی پەرستن بێ و موحەممەد نێردراوی خوایەو لەدڵەوە راستی دەکرد ئەوە دەچێتە بەهەشت ) .

٦ - ملکەچ کردن بۆ مانەکانی ( الإنتماء لحقوقها )
کە بریتـی یە لە کردەوە پێویـسـتەکان بە بێ گەردی بۆ خـوایان بکەی و داوای رەزامـەندی لێ بکەی خـوای گـەورە دەفـەرمـوێ ﴿ وأنيبوا الى ربكم وأسلموا له ﴾ الزمر ٥٤ . واتە : ( بگەڕێنەوە بۆ لای خـوا گـوێ ڕایەڵی بکەن و ملکەچی خـوا بن ) وەدەفـەرمـوێت : ﴿ ومن يسلم وجهه الى الله وهو محسن فقد إستمسك بالعروة الوثقى ﴾ لقمان ٢٢
واتە : ( هەر کـەسێ ڕووی خـۆی بکاتە خـوا و چاکە کـەر بێ ئەوە دەستی بە « لا إله إلا الله » گرتووە بە توندی ) .
٧ - وەرگرتن ( القبول ) : یانی نەدانە دواوە ئەو کەسەی دەزانێ دەڵێ ( لا إله إلا الله ) بەڵام کە بانگی دەکەی بۆ لای ( لا إله إلا الله ) ئەوە لەبەر دەمـارگـیری یا خـۆ بەگـەورە زانی وەری ناگرێ دەیداتە دواوە . خوای گەورە دەفـەرموێ ﴿ إنهم كانوا إذا قيل لهم لا إله إلا الله يستكبرون ﴾ الصـافـات ٣٥ واتە ( ئەگـەر پێ یان بڵێ ی « لا إله إلا الله » خـۆ بەگـەورە دەزانن و باوەری پێ ناهێنن .

# ئەو دەخاڵەی ئیسلام هەڵدەوەشێننەوە

## ( نواقض الإسلام )

ئەی موسڵمانی بەڕێز بزانە زانایان گرنگترین هەڵوەشێنەرەوە کانی ( نواقض ) ئیسلامیان کردۆتە دە خاڵ :

یەکەم : هاوبەش بۆ خوا دانان لەبەندایەتی کردن ، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء ﴾ النساء ٤٨ .واته : ( خوای گەورە لەو کەسە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ بڕیار دەدا بەلام لە گوناهی تر خۆش دەبێ بۆ ئەو کەسەی حەز بکا )

بۆ نموونە کوشتنەوەی ئاژەڵ بۆ غەیری خوا بۆ جن بێ یان قەبری هەر کەسێک بێ یان دوعا کردن لە غەیری خوا وەکو ئەوانەی داوا لەقەبرەکان دەکەن .

دووەم هەر کەسێ واسیتە ( واسط ) پەیدا بکا لە نێوان خۆی و خوادا داوای شەفاعەتیان لێ بکا و پشتیان پێ ببەستێ وەک ئەو کەسانەی شێخێک یان قەبرێک دەکاتە واسیتە لەبەینی خۆیان و خوادا بەبەڵگەی ئەوەی کە هەر مەلیکێک لە دونیا پێویستی هەیە بە یەکێک کە داوای لێبکەی بدهاتە لای ئەگینا

ناتوانی بەبێ پرس بچیە لای ئەو مەلیکە ، ئەوەش نیشانەی نەفامی یە بەراستی چونکە خوای گەورە دەبێنە ڕێز مەلیکێکی زاڵمی دونیا ( ئەوەش هەر خۆی شرکە ) خوای گەورەش دەفەرموێ ﴿ ليس كمثله شئ ﴾ خوای گەورە وەکو مەلیکی دونیا نی یە ئاگای لە کەس نەبێ تا جەنابی شێخ یان قەبرێک داوایەکەی بباتە لای چونکە دەفەرموێ ﴿ وهو السميع البصير ﴾ خوای گەورە هەموو شتێک دەبیستێ و دەبینێ هەر خۆشی دەفەرموێ ﴿ وإذا سألك عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداعي إذا دعان ﴾ البقرة ١٨٦ یانی ئەی موحەممەد ئەگەر بەندەکانی من لە منیان پرسی ئەوا من نزیکم لێیان ( پێویست بەکەس ناکە لە بەینمان بێ ) وەلامی هەموو کەسێک دەدەمەوە کە داوا لەمن بکا

سێ هەم : هەر کەسێ ئەو کەسانەی هاوبەشی بۆ خوا دادەنێن بەبێ بڕوا ( کافر ) نەزانێ گومانی هەبێ لە بێ بڕوایەتیان یان ڕێباز ( مذهب ) ەکەیان بەراست بزانێ ئەوەش بێ بڕواو کافرە بۆ نمونە ئەو کەسەی جولەکەو دیانەکان و شوعیەکان و علمانیەکان بە برای خۆی دابنێ و بە موسلمانیان بزانێ

چوارەم :هەرکـەسێ رێنمـایی ( هدی ) کـەسـێکی تـر یان سـەرۆک حـزبێکی ( ئەگـەر ئـیـسـلامـیـش بێ ) پێ لە رێبـازو رێنمـایی پێـغـەمـبـەر ﷺ چاکـتـرە وەکـو ئەو کەسـانەی حـوکـمی دەرچوان لەدین ( طاغوت ) بەچاکتـر دەزانن لە حوکمی پێغەمبەر ﷺ ئەوەش بێ باوەڕ کافرە .

پێنجەم هەر کـەسێ شتـێکی پێ ناخۆش بێ لەوەی کـە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی لە لایەن خوا ئەگەر کردەوەشی پێ بکا ، چونکە پێ ی ناخـۆشـە ئەوەش بێ باوەڕە وەکـو ئەو کـەسـانەی رکیان لە خۆ داپۆشینی ئافرەتە

شەشەم : هەر کەسێ گاڵتە بە شتێ بە ئایینی پێغەمبەر ﷺ یان گاڵتە بە پاداشت و سزای ئەم شتە بکا ئەوا بێگومان کافرە . خـوای گـەورە دەفـەرمـوێ ﴿ قل ابالله وآياته ورسـوله كنتم تستهزؤن، لا تعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم ﴾ التوبة ٦٥ – ٦٦ واتە : ( ئەی موحـەممەد بڵێ ئایا ئێـوە گاڵتـە بەخـواو ئایەتەکان و پێـغـەمـبـەر دەکـەن ، تازە عـوزرمـەهێننەوە پاش ئەوەی بڕواتان هێنا خۆتان کافر کردەوە ) . دەڵێم وەکو ئەو کەسانەی گاڵتە بەریش و حـیـجاب و سـیـواک و ئەو کـەسانە دەکـەن لە ناهێڵێن جلکـیـان لە گۆزینگیان بێتە خوارێ .

حەوتەم  جادوکەری ( السحر ) هەروا ( صرف ) و (العطف ) ئەمانەش لە جادوگەرینە بە کوردی یانی لێکردنی ژن و مێرد بە دوعاو نوشتە یان ژنەک حەز لە پیاوەکی بکا بەپێچەوانەوە ئەوە ئەمانە هەموو کوفرن .

هەشتەم : پشتیوانی لێکردن و یارمەتی دانی ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن لەسەر موسلمانان ، هەر کەسێ وا بکا بێ باوەڕە ، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ومن يتولهم منكم فإنه منهم ... ﴾ . واتە : هەر کەسێ لە ئێوە خوا نەناس وکافران بکاتە دۆست و پشتیوانی خۆی ئەوە لەوانە ( کافرە )

نۆیەم : هەرکەسێک باوەڕی وابێ کەسانێک هەن مەودایان هەیە لە شەریعەتی ئیسلام دەرچن ئەوە بێ باوەڕە ( کافرە ) وەکو ئەو شێخی تەریقە تانە کە دەروێشەکانیان هەڵدەخەڵەتێنن بەوەی کە ئەوان گەیشتوونە پلەی ( يقين ) حوکمە تەکلیفیەکانیان لەسەر هەڵدەستێ .

دەیەم : روو وەرگێران لە ئاینی خوا هەتا فێری نەبێ و کردەوەی پێ نەکا ئەو کەسەش بێ باوەڕە ( کافرە ) خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ومن أظلم ممن ذكر بآيات ربه ثم أعرض عنها إنا من المجرمين منتقمون ﴾ السجدة ٢٢ . واتە : کێ لەو کەسە ستەمکار

ترە کە ئایەتی خوای بە یاد دەینیەوە پاشان رووی لێ وەردەگێرێ و نایەوێ تێ ی بگا ئێمە تۆڵە لە ستەمکاران دەستێنینەوە .

**تێبینی :** ئەو دەخاڵەی کە دەبێتە هەڵوەشاندنەوەی ئیسلام و باوەڕ هیچ جیاوازی نیە لە نێوان کەسانێک بەقەستی یان بە راستی یان لە ترسان بیکا تەنها کەسانێک نەبێ بەزۆر پێ ی بکرێ یان کەسانێک نەفام بێ و حوکمەکەی نەزانێ وە داوا لە موسڵمانان دەکەین ئەگەر دیتیان موسڵمانێک تووشی یەک لەو دە خاڵانە بوو با هەر لەخۆیەوە حوکمی کافری لەسەر نەدا بەڵکو لەسەری پێویستە حوکمەکەی بۆ روون بکاتەوە ئەگەر شارەزایی هەبوو چونکە ئەم حوکمە را ئاسان نی یە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت زۆر خۆیان لێ پاراستیە

**کۆتایی :** ئەی خوشک و برای موسڵمانم ئاگادار بە ئەم دەخاڵە زۆر گرنگە و زۆر ترسناکە و زۆریش رو دەدا لەسەر موسڵمانان پێویستە ئاگادار بێ و بترسێن لەوەی تووشی بێ ، خودا بمان پارێزی

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك .